# خەمۆکی



## (نەخۆشیی سەردەم)



2019



د. عەبدولکەریم سروش
و: ئاگری ئەفشین

به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

یەکێک لەو هۆکارانەی کە ئەم بابەتەم هەڵبژارد ئەوەیە کە ئێمە ئێستا لە سەردەمێک دەژین، کە دەکرێ ناوی بنێین "سەردەمی خەمۆکی". راستە ئەم سەردەمە بە سەردەمی مۆدێرن، نوێ بوونەوە، شارستانیەت و تێکنۆلۆژیاش ناسراوە، بەڵام گرنگە ئەوە بزانرێ کە خەمۆکی لە دونیای نوێ یەکێکە لە باوترین بابەتەکان. لەوانەیە بینیبێتت یاخود بیستبێتت کە زۆربەی ئەوانەی دەچنە لای دەرونناس، کێشەی خەمۆکی و وەڕەز بوونیان هەیە. هەروەها دەرمانی چارەسەری نەخۆشییە دەرونییەکان و لەوانە خەمۆکی زۆرترین داواکاریی لەسەرە. ئەو دەرمانانە ئەوەندە بە فراوانی بەکاردێن کە وەکوو خواردن ڕۆژانە کەڵکیان لێ وەردەگیرێ. وڵاتان و کۆمەڵگاکان هەرچی بەرەو پێشتر دەچن و مودێرنتر دەبن و هەرچی تێکنۆلۆژیاش بەرەو پێشتر دەڕوات، ئەم نەخۆشیەش بەربڵاوتر دەبێ.

## خەمۆکی چییە؟

ئەگەر لە شارەزایانی بواری "زیندە کیمیا" و شارەزایانی "دەمار" بپرسین، دەبینین کە ئەوان شیکاریان بۆ ئەم نەخۆشیە کردووە و هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ کەم بوونەوەی "سێرۆتۆنینی مێشک". ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ هەست بە خەمۆکی و دڵتەنگی و بێ توانایی بکات و دەستی نەچێتە کارکردن. بەو دەرمانانەشی کە دەیدەنە نەخۆش لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەکانی خۆیان، دەبنە هۆی ئەوەی کە "سێرۆتۆنینی مێشک" لە ئاستێکی بەرزتردا بمێنێتەوە، کە ئەمەش نیشانەی چالاک بوونەوەیە. ئەمە ڕێگەیەکە کە پزیشکان دەیگرنە بەر بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە و هەندێک جاریش کاریگەری هەبووە، بەڵام ئێمە پزیشکانی دڵیشمان هەیە. مەولانا دەگێڕێتەوە کە کاتێک نەخۆشێک دووچاری نەخۆشی ئەوین ببوو، بردبویان بۆ لای پزیشک، پزیشکەکەش گوتبوی:

رنجش از صفرا و از سودا نبود

بوی هر هیزم پدید آید ز دود

دید از زاریش کو زار دلست

تن خوشست و او گرفتار دلست

لەوێدا پزیشکەکە دەڵێ هۆکاری نەخۆشیەکەی ئەو جەستەیی نییە، بەڵکو نەخۆشی دڵە. پزیشکانی دڵیش هەر ئەو عاریفانە بوونە:

این طبیبان بدن دانشورند

بر سقام تو ز تو واقف ترند

هم زنبضت هم ز جسمت هم ز رنگ

صد مرض بینند در تو بي درنگ

پس طبیبان الهي در جهان

چون ندانند از تو بیگفت زبان

کەوابوو پزیشکانی دڵ لە نهێنیە شاراوەکانی تۆ ئاگادارن. ئەو شتانەی کە پزیشکانی جەستەیی نایبینن. پێم باشە روو بکەینە پزیشکانی ئیلاهی کە بزانین لە بارەی خەمۆکییەوە چیمان پێدەڵن. مەولانا لەم بارەوە وتەی زۆرن کە ئێستا بەشێک لەوانە باس دەکەین، بەڵام بەڕای من "حافز" خاڵێکی گرنگی لەم بارەوە باس کردووە، کە لە لای مەولانا دەست ناکەوێت. خاڵێکی گرنگ و حەکیمانە کە ئامانجەکەی بە جوانی پێکاوە، بۆیە دەبێ بە دڵ و گیان گوێی بۆ راگرین، کە بە رای من حافز لەم مەوزووعە پلەیەک لە سەرەوەی مەولانایە، بەڵام وتەکەی ئەو دەخەینە ئاخری ئەم بابەتە، سەرەتا لە بارەی وتەکانی مەولاناوە قسە دەکەین.

## خەمۆکی لە روانگەی مەولانا جەلالەدینی رومی

دیارە مەولانا زۆر بە باشی ئاگاداری ئەم بابەتە بووە و لەبنەڕتدا مرۆڤەکانی دابەش کردووە بۆ دوو دەستە: کەسانی دڵتەنگ و کەسانی خۆشحاڵ، کە زۆر چاکی بۆ چووە. دیارە ئەویش کەسانی خەمناکی لە چواردەوری خۆی زۆر دیون، هەڵبەت نەک ئەو خەمۆکییەی کە ئەمرۆ باوە. زیاتر ئەوانە بوون کە لەگەڵ خۆیان ناکۆک بوون و یەکبوونی دەروونییان نەبوو. مشتومڕی ناو ناخیان ببوە هۆی ئەوەی کە لەگەڵ کەسانی دەروبەریان لە نائارمی و شەڕدا بن، هەروەها لە ناو ناخی خۆشیاندا مشتومریێکی بێ کۆتاییان هەڵدەگیرساند کە خۆشیی و ئۆقرەیی لێ دەستاندن و لە جیاتی ئەوە تاریکی و ڕەشبینی بەسەریاندا زاڵ دەبوو.

یەکەم شوێن کە مەولانا بە خویایی لەبارەی خەمۆکیەوە دەئاخڤێ، لە دەفتەری یەکەمی "مەسنەوی"دایە، کاتێک باس لە چیرۆکی پاشایەکی یەهودی و وەزیرەکەی دەکات، کە قۆڵیان لە کوشتنی گاورەکان هەڵکردبوو. لەوێدا وەزیر فێڵێکی کرد.

بە پاشای گوت: من خۆم وا پیشان دەدەم کە چوومەتە سەر دینی گاوران. تۆش لەسەر گاور بوونی من لووتم ببڕە، ئەوکات من دەچمە ناو کۆمەڵەی گاوران و ئەوانیش بە تەواوی باوەڕم پێ دێنن. جا ئەوجار فیتنەیەک بەرپا دەکەم کە هەموویان لەناوبەرێت. خولاسە پاشا ئەو کارەی کرد و وەزیر چووە ناویان و بوو بە جێی متمانەیان. پێش مردنی 12 وەسیەتنامەی دژ بەیەکی نووسی و دای بە 12 لایەن. دوای مردنی کە ئەو 12 لایەنە وەسیەتنامەکانیان کردەوە، شەڕ و هەرایەک ساز بوو مەگەر خودا بۆ خۆی بزانێ. هیچ کەس ددانی خێری بەوی دیکەدا نەدەنا و هەر لایەنێک خۆی پێ لەوی دی راستر بوو. بەم جۆرە بوو کە یەکرێزی لێ تێکدان و پەرش و بڵاوی کردن. هەڵبەت ئەم چیرۆکە هیچ بنەمایەکی راستی نییە. شتێکی سەیر و سەمەرەی لەم جۆرە لەسەرەتای ئایینی گاوری باس کراوە و مەولاناش لێرە بەم جۆرە بەیانی کردووە. من لێرەدا مەبەستم لە خودی چیرۆکەکە نییە، بەڵکو مەبەست ئەمەیە: مەولانا دەڵێ ئەو وەزیرە کە ئەو لێکجودایی و ئاشوبەی خستە ناویانەوە کەسێک بوو، کە پەی بە یەکڕەنگی عیسا نەبردبوو:

او ز یک رنگی عیسی بو نداشت

وز مزاج خم عیسی خو نداشت

واتە نەیدەزانی کە ئایین هاتووە بۆ یەکڕیزی و یەکگرتوویی. لە هەر شوێنێک جودایی(تفرقە) روبدات شەیتان جێگای خۆی دەکاتەوە. ناکرێ بەوە بگوترێ ئایین، و ناکرێت بدرێتە پاڵ پێشەواو رابەری ئەو دینەش. هەر لەپاش ئەم بابەتی یەکگرتووییە، یەکسەر دێت باس لە خەمۆکی دەکات. هۆکاری ئەوەی کە بۆچی لێرەدا باسی دەکات ئەمەیە:

نیست یک رنگی کز او خیزد ملال

بل مثال ماهی و آب زلال

دەڵێ: "مەبەستم لەم یەکگرتووییە ئەو یەکڕەنگیە نییە کە دەبێتە مایەی بێزاری، بەڵکو من باس لەو یەکگرتووییە دەکەم کە لەنێوان ئاوی دەریا و ماسیدا بوونی هەیە." ماسی هیچ کات لە ئاوی دەریا بێزار نابێ یاخود تێر نابێ. لەگەڵ ئەوەی کە بە شێوەی یەک چەشنیش لە ئاوی دەریادا دەژی. بۆچی وایە؟ چونکە ئاوی دەریا لەگەڵ ماسی پەیوەندیی گیانیی هەیە. ژیانی ماسی لە دەستانی ویدایە.

هرکه جز ماهی ز آبش سیر شد

هرکه بی روزیست روزش دیر شد

درنیابد حال پخته هیچ خام

پس سخن کوتاه باید والسلام

زیرەکترین مەلەوان بخەیتە ناو ئاو دوای ماوەیەک وەڕەز دەبێ، لەبەرئەوەی ئاویی نییە! لە ئاودا ناژی ولەگەل ئاو پەیوەندیی گیانیی نییە، بەڵام ماسی کە خەو و خۆراک و هەموو شتێکی لە ئاوەوەیە، چۆن دەتوانێ بێزار و دڵتەنگ بێ؟ ئەو ژیانی لەوێدایە.

لێرەدا دەرئەنجامێک لەم قسەیەی مەولانا وەردەگرین ئەویش ئەوەیە کە یەک چەشنی مایەی خەمۆکیە و ئەمەش خاڵێکی بنەڕەتییە. هەموو پزیشکانیش لەبارەی خەمۆکیەوە هەر ئەمە دەڵێن. دەڵێن بۆ رزگار بوون لە خەمۆکی کەمترین کار ئەوەیە خۆت لە

یەک چەشنی(یەک ڕەنگی) رزگار بکەی و ژیانێکی فرەچەشنی( رەنگالّەیت) هەبێ. کاتێک هەموو ڕۆژێک یەک جۆرە کار بکەی، یەک جۆر جلوبەرگ لەبەر بکەی، یەک جۆرە خواردن بخۆی، یەک جۆرە سەرچاوەی زانین بەکار بێنی.... هەموو ئەمانە دەبنە هۆی خەمۆکی و بێزار بوون. ( هەندێک جار کەسانێک پێم دەڵێن ئێمە زۆر گوێ لە قسەکانی تۆ دەگرین. ئەمنیش پێیان دەلێم: ئاگاداربن لێی وەڕەز دەبن!)

بەڵام یەک یەکچەشنی هەیە کە نابێتە مایەی بێزاری و خەمۆکی. ئەویش یەکچەشنی ئاوە بۆ ماسی. ناکرێ بەوە بلێین بێزاری. ئاو بۆ ماسی هەموو رۆژ نوێیە و هەروەها هەموو رۆژێکیش ماسی لەو ئاوەدا تازەیە. مەولانا پێی وایە ئەم جۆرە یەکچەشنیە نەک هەر نابێتە هۆی خەمۆکی، بگرە شادی دەبەخشێ بە مرۆڤ و لە خەمۆکی دووری دەخاتەوە و هەمیشە مرۆ خاوێن دەکاتەوە. بەهۆی ئەوەوە چاوێکی تازەت بۆ دەکرێتەوە و جیهان بە جۆرێکی تازەتر دەبینی.

هیچ کەس لە خۆی بێزار نابێ، دەزانم ئێستا هەندێک دەڵێن بۆچی نا، من لەخۆم بێزارم. لە ژیانم بێزارم. پێش ئەوەی وڵامی ئەمە بدەمەوە خاڵێکی دیکە لە وتەکانی مەولانا باس دەکەین: لە ریوایتدا هەیە کە "ئەبو هورەیرە" یەکێک لە یارانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هەموو ڕۆژێک دەچووە دیداری پێغەمبەر. مەولانا دەڵێ پێغەمبەر بە ئەبوهورەیرەی فەرمووە:

"هەموو ڕۆژێک مەیە، دوو ڕۆژ جارێک وەرە بۆ ئەوەی دۆستایەتی نێوانمان بە پتەوی بمێنێتەوە. بۆ ئەوەی دۆستایەتیمان کۆن نەبێ و هەمیشە نوێ بێت." (1) هەموو ئەمانە لەبەر ئەمەیە کە دەڵێن: دووری و دۆستی، چونکە ئەگەر هەمیشە لەلای یەک بین، لێکتر وەڕەز دەبین. مەولانا ئەم باسە دەهێنێتە پێشەوە و دواتر لەگەڵ بابەتێکی دیکەی زۆر گرنگ تێکەڵی دەکات:

(1) هەڵبەت هەندێک لە زانایانی فەرمودەناسی راستی ئەم فەرموودەیە رەتدەکەنەوە و پێیان وایە ئەمە تەنیا پەندێکی عەرەبییە(زر غبا تزدد حبا) نەک فەرمودەی پێغەمبەر (ص)، بەڵام ئیتر لە لایەن شاعیرانی وەکوو مەولاناو سەعدی.. بە ناوی پێغەمبەرەوە وەرگیراوە. و

پنج وقت آمد نماز و رهنمون

عاشقان را فی صلاة دائمون

نه به پنج آرام گیرد آن خمار

که در آن سرهاست نی پانصد هزار

نیست زر غبا وظیفه‌ی عاشقان

سخت مستسقیست جان صادقان

نیست زر غبا وظیفه‌ی ماهیان

زانک بی‌دریا ندارند انس جان

آب این دریا که هایل بقعه‌ایست

با خمار ماهیان خود جرعه‌ایست

هیچ کس با خویش زر غبا نمود

هیچ کس با خود به نوبت یار بود

واته ئێمە موسڵمانان لە ڕۆژێکدا دەبێ پێنج جار نوێژ بخوێنین، بەڵام عاشقان هەمیشە لەناو نوێژدان. لەناو عاشقان (دوو ڕۆژ جارێک وەرە) بوونی نییە، کاتێک عاشقی هات خەمۆکی بار دەکات. مەگەر دەکرێ ئادەمیزاد بە خۆی بڵێ دوو ڕۆژ جارێک وەرە لام؟ دەکرێ تۆ لەگەل خۆت بە نۆرە یار بی؟ واتە بڵێی ئەمرۆ لەلای خۆم دەبم، بەڵام بەیانی لەلای خۆم نابم و دووسبەی دەگەڕێمەوە لای خۆم؟ هیچ کات بەمجۆرە نییە. لەگەڵ بونەوەرێک کە وەک خۆتەو لەگەڵ خۆتدا یەکە، بە قەولی مەلانا "لە منی تۆ منترم" لەگەڵ ئەوەدا ئیتر (دوو ڕۆژ جارێک)نییە، هەموو ساتەکان لەگەل یەکترن بە بێ هیچ بێزاری و خەمۆکییەک.

ئێستا بێینەوە سەر وتەکەی سەرەوە. ئایا دەکرێ ئادەمیزاد لە خۆی بێزار بێت؟ بەڵێ هەندێک وا دەڵێن. زۆرێک لەوانەی کۆتایی بە ژیانی خۆیان دەهێنن، ڕەنگە هەر ئەم

خەمۆکییە یان ئەم بێ مانا بینینەی ژیان وایان لێ بکات دەست بۆ خۆکوشتن بەرن. وڵامی مەولانا بۆ ئەم پرسیارە ئەمەیە:

ئادەمیزاد لەخۆی بێزار و وەڕەز نابێ، بەڵکو لە غەیری خود بێزار دەبێ. هەرکاتێک گوتت لە خۆم بێزارم بزانە کە غەیرە خودێک خۆی لە ناختدا حەشار داوە، کە خۆت نیت. ئادەمیزاد لە خودی خۆی دڵتەنگ نابێ، بگرە پەیوەندییەکەشیان لە ئاو و ماسی لێک نزیکترە:

تا تو تاریک و ملول و تیرەای

دان که با دیو لعین همشیرەای

کاتێک بەرامبەر خۆت ڕەشبینی و ڕقت لەخۆت دەبێتەوە و دووچاری خەمۆکی دەبی، بزانە کە دێوێک لە ناختدا شوێنی خۆی کردۆتەوە. واتە یەکێک کە غیری خودی خۆتە. ئەمە ئەو کاتەیە کە ئەو بوونەوەرە بێگانەیە لە ناخی تۆدا بارت قورس دەکات و تۆ لەبەرامبەر ئەو لاواز دەبی:

در زمین دیگران خانه مکن
کارخود کن؛کار بیگانه نکن

جاری وا هەیە بێگانەیەک دێت و بێگاریت پێ دەکات، بەڵام تۆ پێت وایە کە کار بۆ خۆت دەکەی، کەچی بێگاری بۆ بێگانەیەک دەکەی و خزمەت بەو دەکەی.

(جارێکیان لە "لەندن" لە ماڵێک بووم. بوکێک کە تازە هاوسەرگیری کردبوو، ئەویش لەوێ بوو. داپیرەی زاوا پێی گوتم ئەم بوکەمان لە دێو و جندوکە و ئەو شتانە دەترسێ. پیاوی چا بە و دوو قسەی لەگەڵ بکە بەشکم لە کەری شەیتان بێتە خوارێ. ئەمنیش قسەم لەگەل کرد و ئەم شێعرەی سەعدیم بۆ باسکرد.) سەعدی شیرازی قەسیدەیەکی دووروودرێژی هەیە، لەوێدا لە شوینێک دەڵێ:

دیو با مردم نیامیزد مترس

بل بترس از مردمان دیوسار

دێو دەکاردا نییە، بەڵام مرۆڤی دێو سفەت زۆرن، دەبێ لەوان بترسی نەک لە دێو و جندوکەو پری. مرۆڤی دێو سفەت ئەوانەن کە دێو چۆتە ناو ناخیان و کردوونی بە دێو و ئەمانەش کەم نین و دەبێ پەنا بۆ خودا ببردرێ:

قل اعوذ برب الناس... من الجنة والناس

ئەم غەیرە خودە یان ئەم دێوە کە دێت و خۆی دەخزێنێتە ناو ناخی مرۆڤەوە، گرنگترین ڕۆڵی ئەوەیە کە لە یەکگرتوویی دەرون داتدەبڕێ. جودای دەخاتە ناو خۆت و خودەکەتەوە. ئەم دووانیە مشتومڕ دروست دەکات و ئەم مشتومڕەش ڕەشبینی و خەمۆکی و بێزاری دروست دەکات، هەروەها ئەمەش ڕێگر دەبێ لەوەی لە ژیانتدا چالاکییەکی مانادار و بە بەرهەمت هەبێ. لە جیاتی ئەوە هەمیشە لەناو مشتومڕی دەرونیتدا دەمێنیەوە و زۆرجاریش ئەو غەیرە خودە یان ئەو دێوە بەسەرتدا سەردەکەوێ، مەگەر ئەوەی تۆ لە فریشتە سفەتێک داوای هاوکاری بکەی. کە ئەو فریشتە بتوانێ بەسەر ئەو دێوەدا زاڵ بێت و نەفسی خۆت بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی و یەکگرتوویی بەدەست بێنیتەوە. جا بۆیە دەکرێ مرۆڤ لە خۆی بێزار بێ و دڵتەنگ بێ، ڕاستە، بەڵام لە شیکاریی وردبینانەی کۆتاییدا، ئەوە خودی مرۆڤ نییە کە خۆشی لە خۆی نایەت، بەڵکو ئەوە رقێکە بەرامبەر بێگانەیەک کە لە ناخیدا خۆی مەڵاس داوە و هەڵبەت دەبێ خۆشیشی لێی نەیەت. ئەگەر گەیشتیە ئەوەی کە توانیت ئەو بێگانەیە بناسی ئەوجار دەبێ بیر لە وەدەرنانی بکەیەوە:

چارەی آن دل عطای مبدلیست

داد او را قابلیت شرط نیست

واتە کەسێک کە بێت و ئاڵوگۆڕ بخاتە ناو ناخی مرۆڤەوە. مەولانا پێی وایە ئەو شتەی کە دەتوانێ ئاڵوگۆڕ بخاتە ناو ناخی مرۆڤەوە، بریتییە لە عەشق و ئیمان، کە ئەم دووانە لە یەک سەرچاوەوە هەڵقوڵاون. تایبەتمەندی ئەم دوانەش ئەوەیە کە ڕەوشت و پێکهاتەی ناخی مرۆڤ بە تەواوەتی دەگۆڕن. ئیمان و عەشق ئەو دوو شتەن کە ئادەمیزاد لێیان تێر نابێت و بەرامبەر ئەمانە هەرگیز بێزار و دڵتەنگ نابێ. نزیکترین شت لە گیانی ئادەمیزاد عەشق و ئیمانە.

کەوابوو یەکڕەنگی یان یەک چەشنی دەبێتە مایەی بێزاری و خەمۆکی. غەیرە خود و بێگانەکان کاتێک خۆیان دەخزێننە ناو ناخی مرۆڤ، یەکڕەنگی دزێو لەگەڵ خۆیان دەهێنن و مشتومڕ بەرپا دەکەن و مرۆڤ بێ توانا دەکەن. بۆ ئەوەی ئەم خەمۆکییە وەلا بنرێ، مرۆڤ لە ڕواڵەتدا دەبێ بەرەو فرەچەشنی بڕوات. واتە دەبێ ڕۆح لە لەناوچوون بپارێزێت. دەبێ حەرەکەتێک لە دەرونیدا دروست بکات.

لە شوێنێکی دیکەدا مەولانا دەڵێ:

هر زمان نو صورتی و نو جمال

تا ز نو دیدن فرو میرد ملال

واتە ئادەمیزاد دەبێ ڕۆحی، جوانی و مەنزەرەی تازەتر ببینێ. کە ببێتە هۆی ئەوەی خەمۆکی لە خۆی دوورخاتەوە. واتە بەرامبەر ئەو یەکڕەنگیەی ئەمرۆ بوونی هەیە بەرهەڵەستی نیشان بدات، بەڵام ئەوەش بڵێم لەم جیهانەی ئێستا ئێمە تێیدا دەژین، چەشنێک یان ڕەنگێکی ڕاستی بوونی نییە. چەشنەکان هەموویان کۆنن. ئەگەریش تازە بن، زۆر زوو کۆن دەبن. ئەو نوێیانەی کە نوێ بن و هەر بە نوێی بمێننەوە، کەمن. دەزانی نوێیەکانی ئەم ژیانە چۆنن؟ وەکوو نوکتەی پێکەنیناویین. نوکتەیەکی خۆش کاتێک بۆ جاری یەکەم گوێت لێ دەبی، پێدەکەنی، بەڵام بۆ جاری دووەم ئیتر کۆن دەبێ. نوێیەکانی ئەم جیهانە ئێستا بارودۆخیان بەم شێوەیە. ئەو نوکتەیەی کە هەمیشە بە نویی بمێنێتەوە واتە هەمیشە بە شادی بتانهێڵێتەوە، ئەوە لە پێکهاتەیەکی دیکەیە، وەکوو ئاو بۆ ماسی.

گر نبینی رفتن آب حیات

بنگر اندر سیر این جوی نبات

آب چون انبەتر آید در گذر

زو کند قشر صور زوتر گذر

چون بە غایت تیز شد این جو روان

غم نپاید در ضمیر عارفان

واتە ئەم جۆگە ڕەوانەی عاریفان کە بە خێرایی دەڕوات، خاشاکی خەم لێی نانیشێ. خاشاکی خەم کاتێک لە ڕوی ئاو دەمێنێتەوە کە ئاو ڕاوەستاو بێت. هەم سەرەوەی خاشاک دادیدەگرێ هەم بۆگەنیش دەکات، بەڵام کاتێک ئەم حەرەکەتە ڕوحیە بەدەستهات، هیچ خڵت و خاشاکێک بوونی نابێ. لەوانەیە بپرسی کە ئێمە لە کوێ دەتوانین ئەمانەمان دەستکەوێ؟ دەبێ بڕۆی بگەڕێی و هەوڵی بۆ بدەی، بەڵام یەکێک لە ڕێگاکان، هەر ئەم دیوانی شێعرەی مەولانایە (مەسنەوی مەعنەوی). من خۆم هەر کات دەیخوێنمەوە، وەکوو ئەوەیە کە مرۆڤ لە ئاوێکی پاکدا خۆی خاوێن دەکاتەوە و شادییەکی نوێ دەداتە مرۆڤ.

ئیمامی عەلی لە بارەی پێنج رکاتە نوێژەکە قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ:
"ئەم پێنج رکاتە وەکوو چۆمێکە لە دەروەی ماڵ کە مرۆڤ ڕۆژێ پێنج جار خۆی لەو چۆمەدا دەشوات. ئیتر هیچ چڵک و پیسییەکی پێوە نامێنێ."

لەمەش سەرترمان هەیە. مەولانا هەنگاوێکی دیکە دەمانباتە پێشتر و ڕێگایەکی دیکەمان پێ نیشان دەدات:

خوي بد دارم ملولم تو مرا معذور دار

خوي من كي خوش شود بي روي خوبت اي نگار

بي تو هستم چون زمستان خلق از من در عذاب

با تو هستم چون گلستان خوي من خوي بهار

بي تو بي عقلم ملولم هر چه گويم كژ بود

من خجل از عقل و عقل از نور رويت شرمسار

آب بد را چيست درمان باز در جيحون شدن

خوي بد را چيست درمان بازديدن روي يار

آب جان محبوس مي بينم در اين گرداب تن

خاک را بر مي كنم تا ره كنم سوي بحار

شربتي داري كه پنهاني به نوميدان ده

تا فغان در ناورد از حسرتش اوميدوار

چشم خود اي دل ز دلبر تا تواني برمگير

گر ز تو گيرد كناره ور تو را گيرد كنار

لێرەدا مەولانا ڕێگەیەکی زۆر جیددی و کرداری دەخاتە بەردەستمان. لەسەرەتادا دەڵێ من خووی خراپم هەن و دڵتەنگ و بێزارم و خەڵکیش لێم جاڕزن. خەمۆکی و بێزاری وەکوو پەتایە واتە دەگوێزرێتەوە بۆ خەڵکی چواردەوریشت. لە شوینێکی دیکە دەڵێ:

در محفل خود راه مده همچو منی را

افسرده دل افسرده كند انجمنی را

واتە مرۆڤێکی خوڵق ناخۆش و دڵتەنگ هەموو چواردەورەکەشی دڵتەنگ و بێزار دەکات. مرۆڤێکی شادیش هەموو چواردەورەکەی خۆشحاڵ و شادمان دەکات. ئەم پەتایە چۆن دەکرێ چارەسەر بکرێت؟ لێرەدا لەم غەزەلەی سەرەوە دەڵێ لەکاتی خەمۆکی هەرچی دیلێم و دەیکەم ڕاست نییە و هەمیشە لەنگە. دەڵێ ئەگەر تۆ ئاوێکی تێکەڵەت هەبێ و خاوێن نەبێ، بۆ ئەوەی ئەم ئاوە لە ئاڵودەیی و تێکەڵی و پیسی خاوین بکەیەوە، دەبێ ئەو ئاوە بڕژێنیتە ناو دەریاوە. دەریا ئەو ئاوە دەشواتەوە و پیسیەکەی لێ دەکاتەوە:

آب گفت آلوده را در من شتاب

گفت آلوده كه دارم شرم از آب

آب كوزه چون در آب جو شود

محو گردد در وی و جو او شود

وصف او فانی شد و ذاتش بقا

زين سپس نه كم شود نه بدلقا

ئەی دەرمانی خووی خراپ چییە؟ بینینی ڕووی یارە، بەڵام بۆ دەرمانی خەمۆکی دەبێ ڕوو بکەیتە هاوڕێیەک کە وەکوو دەریا بێت بۆ ئەوەی گۆزە ئاوەکەی خۆت

لەگەڵ ئەو دەریایەدا تێکەڵ بکەی. ئادەمیزاد هەمیشە وابیر دەکاتەوە کە خۆی بەتەنیا دەتوانێ هەموو کارەکانی خۆی بکات. لە راستیدا وانییە، ئێمە دەبێ دان بەوەدا بنێین کە لە زۆر شت دەستەوەستانین. واتە ئێمە لە ژیانی رۆژانەمان دەتوانین رووبەڕوی کێشەی بچوک ببینەوە، بەڵام بۆ رووبەڕوو بوونەوەی کێشەی گەورە پێویستمان بە هاوکاری دەرەکی هەیە.

ئێمە ئەگەر بمان توانیبا هەموو کێشەکانمان خۆمان چارەسەرمان دەکرد، هەروەها هەموو شتە چاکەکانیشمان بۆ خومان داوا دەکرد، بەڵام ناتوانین. ئەمە یەکەمین دانپێدانانە کە مرۆڤ دەبێ بیکات. ئەم دانپێدانانەش بەمانای کەمی ئێمە نییە کە دەستەوەستانین، بەڵکو ئەمە داننانە بەو ڕاستیەدا کە ئێمە وا دروست کراوین و ناتوانین دەستمان بە هەموو شتێک رابگات:

خرم آن کین عجز و حیرت قوت اوست

در دو عالم خفته اندر ظل دوست

بۆ رزگار بوون لەم کێشانە دەبێ هاوکاری لە رۆحە گەورەکان وەربگریت. بە هۆی پەیوەندی لەگەڵ ئەوان دەبێ جۆگەی ناخی خۆت تێکەڵ بە دەریا بکەی. مەڵێ ئەمانە بوونیان نییە، منیش دەزانم کەمن، بەڵام ئایا گەڕاوی بزانی نییە؟ کەوابوو:

آب بد را چیست درمان باز در جیحون شدن

خوي بد را چیست درمان بازدیدن روي یار

دێڕی دواتر کە هومێدێکی زۆر دەداتە ئادەمیزاد. مەولانا وەک عادەتی هەمیشەیی کە ئومێد باڵی بەسەر وتەکانیدا کێشاوە و هیچ کات باس لە نائومێدی و بێ هیوایی ناکات. لەم قسەیە کە مەبەستی لە خودایە، دەڵێ:

شربتی داري کە پنهانی بە نومیدان دە

تا فغان در ناورد از حسرتش اومیدوار

واتە تۆ شەربەتی هیوا دەدەی بەو کەسانەی کە دووچاری نائومێدی بوونە، تا هومێدەواران داخی بۆ هەڵنەکێشن. ئەمەش رێگایەکی دیکەی مەولانا بوو بۆ چارەسەر کردنی خەمۆکی. ئەم دەریایانە، واتە ئەم عاریفانە مردو و زیندووی پێ ناوێ.

پێویست ناکات بچی و لە دوای زیندووەکان بگەڕێی بۆ وەدەستهێنانی دەرمانی ئەم دەردە. ئەو بەرهەمانەی لەدوای خۆیان جێیان هێشتووە، هەموویان دەرمانن بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشیە.

مەولانا لە شوێنێکی دیکە کە باس لە خەمۆکی دەکات، ئەوکاتە بووە کە لە مەجلیسی خۆیدا کەسانێکی دەبینی بێزار وەڕەز بوون. مەولانا هیچ کات شێعرەکانی لەسەر کاغەز نەدەنووسینەوە. لە خەڵەوەتی خۆیدا کە شێعرێکی بە دڵ و مێشکیدا دەهات، دوای بیر لێکردنەوە دەهات لە جەمی رەفێقان دەیخوێندەوە و لەلایەن کەسانی دیکەوە دەنووسرانەوە. لەناو گوێگران هەندێکجار کەسانێک چۆرتیان لێدەدا و باوێشکیان دەهات و هەستیان بە بێزاری دەکرد. ئەوەتان لە بیر بێت ئەوانەی کە لە مەجلیسی مەولانا دادەنیشتن  و بۆ یەکەم جار گوێیان لە وتەکانی مەولانا دەگرت، کەسانی زانا و دانا نەبوون، بەڵکو کاسبکار و خەڵکی ئاسایی بوون. مەولاناش بە گوێرەی گوێگرەکانی هەندێک جار قسەی زۆر قووڵ و پڕمانای دەکرد و هەندێک جاریش قسەی زۆر ناحەزی دەکرد.(ناحەز: واتە وشەی ناحەزی لە شێعرەکانیدا بەکاردەهێنا، دەفتەری پێنجەمی مەسنەوی چیرۆکی زۆری لەم جۆرەی تێدایە کە وشەی بێ ئەدەبانەی تیدا بەکار هاتووە. لە خۆم دەپرسی بۆ دەبێ وابێ؟ تاکە وڵامێک کە پێی گەیشتم ئەوەبوو کە لەوانەیە گوێگرانی مەولانا لەو دەفتەرەدا گوڕدرابن. مەولانا سەیری مەجلیسەکەی کردووە و زانیویەتی ئەوانە ئەم چیرۆکانە زیاتر تێدەگەن و زیاتر پەسندی دەکەن، نەک باسی فیکری قووڵ و نهێنی ئامێز.) هەمیشە هەوڵی دەدا خۆی لە بێزار بوون رزگار بکات یان لەخۆی دووری خاتەوە. لە غەزەلێک لە دیوانی شەمسدا دەڵێ:

ملولان همه رفتند در خانه ببندید

بر آن عقل ملولانه همه جمع بخندید

به معراج برآیید چو از آل رسول

رخ ماه ببوسید چو بر بام بلندید

دەڵێ ئەوانەی دڵتەنگ و بێزارن، رۆیشتن و دەرگاکان دابخەن. ئەوانەی کە ناتوانن شادیی ئێمە ببینن. ئەوانەی کە هیچ کات لەگەڵ خۆیان شاد نەبوونە. لە شوێنێکی

دیکە دەڵێ لەگەل ئەوانەی کە مورچ مۆنن، منیش مۆن دەبم، ئەوانەی گفت خۆش بن و خولقیان خۆشە منیش گفت و خولق خۆشم. ئەوانەی کە شیرینن ئەوانەی کە رویان کراوە و گەشە، من لەگەل ئەوانە خۆشحالم:

با ترشانش ترشم با شکرانش شکرم

روي من او پشت من او پشت طرب خارم از او

صد چو تو و صد چو منش مست شده در چمنش

رقص کنان دست زنان بر سر هر طارم از او

طوطي قند و شکرم غير شکر مي نخورم

هر چه به عالم ترشي دورم و بيزارم از او

ئەوانەی کە هەمیشە شاد نەبووبان نەیاندەتوانی لە مەجلیسی مەولانا خۆڕاگربن. مەولانا دەیگوت قسەکانی من هەموو نوێن و ئاوی ژیانن:

اين شنيدی مو به مويت گوش باد

آب حيوان است خوردی نوش باد

آب حيوان خوان مخوان اين را سخن

روح نو بين در تن حرف کهن

چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە بێن و لە مەجلیسی وی باوێشکان بدەن و لێی بنون. دەیگوت ئەم قسانە لای من ژیانێکی نوێیە و تەمەنێکی دووبارەیە:

بر ملولان اين مکرر کردنست

نزد من عمر مکرر بردنست

شمع از برق مکرر بر شود

خاک از تاب مکرر زر شود

اين رسولان ضمير رازگو

مستمع خواهند اسرافیل‌خو

تا ادبهاشان بجاگه ناوری

از رسالتشان چگونه بر خوری

نه گدایانند کز هر خدمتی

از تو دارند ای مزور منتی

شمع از برق مکرر بر شود

خاک از تاب مکرر زر شود

گر هزاران طالب‌اند و یک ملول

از رسالت باز می‌ماند رسول

ئەم بەیتەی کۆتایی کە دەڵێ: (هەزارن گوێگر هەن، بەڵام ئەگەر یەک کەس دڵتەنگ و بێزار بێ، پێغەمبەر لە پەیامەکەی خۆی دوا دەکەوێ)، بەڵام یەکسەر دێت و قسەکەی خۆی کامڵ دەکات و راستی دەکاتەوە. دەڵێ: نەخێر، پێغەمبەر لە پەیامەکەی دواناکەوێ، ئەوانەی کە دڵتەنگ دەبن ئەوانە پێغەمبەرانی راستەقینە نین:

لیک با بی‌رغبتیها ای ضمیر

صدقه‌ی سلطان بیفشان وا مگیر

اسپ خود را ای رسول آسمان

در ملولان منگر و اندر جهان

فرخ آن ترکی که استیزه نهد

اسپش اندر خندق آتش جهد

گرم گرداند فرس را آنچنان

چشم را از غیر و غیرت دوخته

همچو آتش خشک و تر را سوخته

گر پشیمانی برو عیبی کند

آتش اول در پشیمانی زند

خود پشیمانی نروید از عدم

چون ببیند گرمی صاحب‌قدم

ئەم قسانە بەڕاستی بێ وێنەن. باس لە حاڵی پێغەمبەرانی خودا دەکات. دەڵێ خۆ پێغەمبەران لەو کەسانە نین کە زوو لە ڕێگادا بێزار و ماندوو بن و کۆڵ بدەن. تا کۆتایی تەمەنیان لەسەر ئەم پەیامە بەردەوام دەبن و کۆڵ نادەن و لە گەیاندنی ئەو پەیامەش بێزار نابن. دەڵێن: ئێمە چاو لەوانە ناکەین کە بێزارن و ئیتر ئێمەش دەست لە پەیامەکەی خۆمان هەڵگرین. لەو بەیتەی کوتایی دەڵێ پەشیمانییش جۆرێکە لە جۆرەکانی خەمۆکی و بێزاری و یەکێکە لە هۆکارەکانی خەمۆکیش. کاتێک پەشیمان دەبیەوە ئیتر دووچاری خەمۆکی دەبی. مەولانا دەڵێ پیاوانی خودا هیچ کات پەشیمان نابنەوە. لەبەرئەوەی ئەسپی خۆیان تاو داوە و بەخێرایی دەڕۆن و ئاوڕ نادەنەوە و گەرم داهاتوون. کەسێک کە سەبر بروات پەشیمان دەبێتەوە، هەمیشە دوودڵە لە کارەکانی، دڵنیا نییە لەوەی کە تا ئێستا ڕێگاکە بە دروستی هاتووە یان نا. هەرئەوەندەی کەسێک لەڕێگا توشیان بێت و پێیان بڵێ بۆ کوێ دەچن یان بۆ ئاوا دەکەن، یەکسەر دەست هەڵدەگرن و لە رویشتن کۆڵ دەدەن و پەشیمان دەبنەوە و دووچاری خەمۆکی دەبن، بەڵام ئەوانی دیکە کاتێک دەبینن ئەم ڕێگایە گەرمە و چالاکە، ئیتر پەیشمانی لەوێدا مانا نادات:

ترک این فکر و پریشانی بگو

حال و یار و کار نیکوتر بجو

ور نداری کار نیکوتر به دست

پس پشیمانیت بر فوت چه است

لەبارەی پیاوانی خوداوە دەڵێ: نەک تەنیا پەشیمان نابنەوە و دڵتەنگ نابن، بەڵکو رزگاریشتان دەکەن لە دەست خەمۆکی. لەبەرئەوەی لە دەرونیانەوە گەرمییەکیان هەیە یاخود پاڵنەرێکیان هەیە کە ڕێگە نادات ساردی ڕوویان تێبکات:

کار مردان روشنی و گرمی است

کار دونان حیله و بی‌شرمی است

کەسانی سەرکەوتوو واتە پیاوانی خودا دوو کاریان هەیە: یەکیان رۆشنایی و ئەنگیزەیە و ئەوی تریش وزە و گەرمییە. ریک وەکوو "خۆر" وان. ئەم خۆرە گەرمە سەهۆڵی ساردی دەرونتان دەتوێنێتەوە و رزگارتان دەکات لە بێزاری و خەمۆکی. مەولانا دەڵێ پێغەمبەر چوو بۆ میعراج، ئێمەش کە شوێن کەوتووی ئەوین دەتوانین بچین:

به معراج برآیید چو از آل رسول

رخ ماه ببوسید چو بر بام بلندید

واتە ئەو رێگاکەی پێ نیشان داین کە ئێمەش بەدوایدا بڕۆین. ئەمە ئەزمونێکی پێغەمبەرانەیە کە بۆ هەمووان رەوایە. واتە پێغەمبەر نەهاتووە تەنیا فەرمان بە کاری چاک و ڕێگری لە کاری خراپە بکات، بەڵکو هاتووە تا ئەزمونەکانی خۆی فێری ئێمە بکات، کە ئێمەش ئەم ڕێگایە بگرینە بەر و هەر کەس بە پێی توانا و زەرفیەتی خۆی سوود لەم ئەزمونانە وەربگرێ.

## خەمۆکی لە روانگەی حافزی شیرازی

ئێستاش با ببێینە سەر ئەو خاڵە گرنگەی حافز کە لە سەرەتاوە ئاماژەم بۆ کرد:

در این زمانه رفیقی که خالی از خلل است
صُراحی مِی ناب و سفینه ی غزل است
جریده رو که گذرگاه عافیت تنگ است
پیاله گیر که عُمر عزیز بی بدل است
نه من ز بی عملی در جهان ملولم و بس
ملامت علما هم ز علم بی عمل است
به چشم عقل درین رهگذر پر آشوب
جهان و کار جهان بی ثبات و بی محل است
بگیر طُرّه ی مه طلعتی و قصّه مخوان
که سعد و نحس ز تأثیر زُهره و زُحل است
دلم امید فراوان به وصل روی تو داشت
ولی اجل به ره عُمر رهزن امل است
به هیچ دور نخواهند یافت هشیارش
چنین که حافظ ماست باده ازل است

بەڕاستی کە غەزەلێکی بێ وێنەیە، بەڵام لێرەدا خاڵێکی تێدایە کە من لە دیوانەکانی مەسنەوی و شەمسدا بەرچاوم نەکەوتووە. بۆیە ئینساف وا داوا دەکات ئەم خاڵە هەر بەنێوی خودی حافزەوە بکرێت. دەڵێ:

نه من ز بی عملی در جهان ملولم و بس
ملامت علما هم ز علم بی عمل است

ساڵانێکی زۆر من سرنجی ئەم شێعرەم داوە و هەمیشەش ئافەرینم بە حافز گوتوە. یەکێک لە هۆکارەکانی خەمۆکی و بێزاری زانستێکە کە کردەوەی پێ نەکەی. تا ئێستا ئێمە باسمان لەم خاڵە نەکردبوو. باسمان لەوە کرد بەهۆی کەم بوونەوەی سێرۆتۆنیونی مێشک خەمۆکی پێش دێت. مەولاناش هۆکارەکەی گەڕاندەوە بۆ ئالۆزیی دەرونی و لێکجودایی و لە دەستدانی یەکگرتووی دەرون و یەک چەشنی ژیان، هەروەها ڕێگە چارەشی پێ نیشان داین، بەڵام ئەوەندەی من بەبیرم بێت لە هیچ شوێنێک نەیگوتوە زانستی بێ کردەوە دەبێتە هۆی خەمۆکی. ئەم بابەتە هەموو پایەکان دەگرێتەوە. بە خویایی دەڵێ خەمۆکیی زانایانیش لە زانستی بێ کردەویە. وادانێ لێرەدا مەبەستی لە زانایانی ئایینیە، بەڵام ئەم قسەیە هەموو زاناکان دەگرێتەوە چی ئایینی یان غەیری ئایینی.

زۆرجار کاتێک ئادەمیزاد لەگەڵ خۆی دەکەوێتە ناو مشتومڕەوە و دووچاری خەمۆکی دەبێ، لەبەر ئەوەیە خۆی شتێک دەزانێ، بەڵام بە پێچەوانەوە ڕەفتار دەکات. ئەمە ویژدانی ئازار دەدات. ئەگەر بە رواڵەت دەری نابڕێ، بەڵام لەناوەوە ئازاری دەدا، ئەمەش خۆی خەمۆکیە. بەتایبەت کاتێک ئەم شتە دووبارە دەبێتەوە. ئێستا تۆ وابیر مەکەوە کە ئێمە دەبێ زانا بین تا دووچاری بارودۆخێکی لەم جۆرە بین، نەخێر، ئێمە خۆمان زۆر شت دەزانین و بە پێچەوانەشەوە هەڵسوکەوت دەکەین. واتە ئێمە دەزانین ڕاستیەکە چیە کەچی ڕەفتاری پێ ناکەین. دەڵێن کابرایەک چووبووە لای زانایاکی زانستی ئاکار کە ئامۆژگاری بکات. ئەویش پێی گوتبوو باوەڕناکەم شتێک هەبێ من بیزانم و تۆ نەیزانی. زاناکە لێی پرسی بوو: تۆ نازانی درۆکردن خراپە؟ ئەویش گوتبوی بەڵێ دەزانم. دووبارە لێی پرسی: نازانی قسەی ڕاست باشە؟ گوتبووی بەڵێ دەزانم. یا لێی پرسی بوو نازانی مافی خەڵک خواردن خراپە؟ گوتبووی بەڵی دەزانم. دواتر گوتی دەی هەموو هەر ئەم شتانەیە. ئێمە بە ئاگادار بوون لەمانە دەڵێن زانین یان زانست، بەڵام چونکە ئێمە ئەم شتانەمان وەکوو هەوا هەڵمژیوە و بە ئاسانی بەدەستمان هێناون، ئیتر نرخیان نازانین:

هر که او ارزان خرد ارزان دهد

گوهری طفلی به قرصی نان دهد

واته ئەوەی بە ئاسانی بەدەست بێت، بەئاسانیش لەدەست دەچێت. ئێستا من کە دەزانم راستگۆیی باشە، ئەگەر درۆ بکەم، بە قسەی حافز ئەمە دەبێتە مایەی خەمۆکی. واتە من ویژدانی خۆم لە ناخمەوە ناڕازییە. ئەگەر لە دەرەوە نیشانی نەدەم کە نیگەرانم، لە ناوەوە وەکوو ژەهرێک گیانم ژەهراوی دەکات و دڵتەنگ دەبم. ئەگەر ئێستا من بازنەی زانینەکانم فراوانتر بکەم و زیاتر بزانم و زیاتر بە پێچەوانەی زانینەکانم رەفتار بنوێنم، هەروەها زیاتر پێشێلی راستییەکان بکەم چ لەبەرامبەر خۆم یا لەبەرامبەر کەسانی دەوروبەری خۆم یان لەبەرامبەر خودا، پێناسەیەکی گشتی بەرامبەر ئەم پێشێلکاریانە دەکرێ لەدەستەواژەی "بێشەرمی"دا کورت بکرێتەوە. واتە بێشەرمی بەرامبەر خۆت یان خەڵک یان خودا، ئەمانە هەموو دەبنە هۆی خەمۆکی. چونکە من خۆم دەزانم کە بە هەڵە رەفتار دەکەم. چونکە دەزانم کە مافی خەڵکانی دیکە پێشێل دەکەم. هەرجارەی بە هەڵە رەفتار کردن مرۆڤ خەنجەرێک لە رۆحی خۆی دەدات، واتە دەورنی خۆی زامدار دەکات. وای لێدێ کەم کەم ویژدانی دەمرێ ئیتر هەست بە هیچ شتێک ناکات. کەسانێک کە بەو رادەیەی زانستیان هەیە رەفتار دەنوێنن، واتە هەم لەگەڵ خۆیان راستگۆن و هەم لەگەڵ خەڵکیش، دڵنیا بن ئەوانە کەسانێکی شاد و چالاکن، چونکە هیچیان نییە خەمی لێ بخۆن. لەگەڵ خودا راستن و لەگەڵ خەڵکیش راستن. کەیف و سەفا دەکەن لەم راستگۆییە. بۆ دەبێ دڵتەنگ بن؟ کەسێک پزیشکی خوێندووە، بەڵام وەلای ناوە و کاری پێ ناکات. دەڵێن ئەدی بۆ چوویە ئەو بەشەت خوێندووە؟ واتە خەمۆکیی زانایان لە بێ کردارییە بەو زانستە. دەزانی ئەم وتەیە یانی چی؟ یانی بەو رادەیەی کە دەتوانی کردەوەت هەبێ، شت فێر ببە، نەک زیاتر، چونکە ئەوکات دووچاری خەمۆکی دەبی.

سەعدی دەڵێ:

از صد یکي به جاي نیاورده شرط علم

وز حب جاه در طلب علم دیگري

از من بگوی عالم تفسیرگوی را

گر در عمل نکوشی نادان مفسری

علم آدمیتست و جوانمردی و ادب

ورنی ددی، به صورت انسان مصوری

کاتێک ئادەمیزاد خەیاڵ و سەودای پلەو پایەی لەسەردا بێت، ئەگەر بەو پلەو پایە نەگات دووچاری خەمۆکی دەبێ. شاعیرێکی عەرەب هەیە بە ناوی " طغبرانی الأصبهانی" دەڵێ:

تقدمتني أناسٌ كان شوطُهمُ

وراءَ خطوي لو أمشي على مهلِ

خەفەت دەخوا دەڵێ کەسانێک ئەمرۆ پێش من کەوتونەتەوە کە ئەگەر من بە پێیان بڕۆم و ئەوان غار بدەن، هەر من دەیبەمەوە. ئەم جۆرە کەسانە لە ژیانیاندا ئاسودە نین. دەڵێ ئەگەر تۆ غاریش بدەی بە من ناگەیەوە. بۆیە پەیامەکەی حافز ئەوەیە بە پێی توانا ئەوەندەی دەتوانی کردەوەت هەبێ، شت فێر ببە. مەولانا دەڵێ زانست بارێکە بە کۆڵی مرۆڤەوە، مەگەر ئەوانەی توانیبێتیان بەسەر زانستدا زاڵ بن، لە جیاتی ئەوەی زانست بەسەریاندا زاڵ بێت، ئەوکات دەبنە هەڵگرانی راستی:

علمهای اهل دل حمالشان

علمهای اهل تن احمالشان

یارانی دڵ، زانستەکەیان هەڵیان دەگرێ و بەرزیان دەکاتەوە، واتە باریان سووکە، بەڵام یارانی جەستە، زانست بارە بەسەریانەوە، واتە باریان قورسە:

باش تا روزی که محمولان حق

اسب تازان بگذرند از نه طبق

ئەمەش باسی نەخۆشیی خەمۆکی و چارەسەرەکەی بوو لە لایەن حافزەوە. لە شوێنێکی دیکەش دەڵێ بەختی نوستووی مرۆڤ دەبێتە هۆی خەمۆکی. بەختی خەوتوو هەر ئەوەیە کە لەژیانی ئادەمیزاد فرەچەشنی روو نەدات. بەڕای من زانستی بێ کردەوە کە باسی کرد لە هەموو خاڵەکانی دیکە گرنگترە. کاتێک هەموو ئەمانە لەتەنیشت یەکترەوە دابنێی، دەبینی کە ئەو زانا گەورانە چی فەزایەکی واڵا و نوێمان بۆ دروست دەکەن.

لە کۆتاییدا دەمهەوێ باس لە ئەزمونێکی خۆم لەگەڵ حافز بکەم: من هەندێ جار سوود لە فاڵی حافز وەردەگرم! جارێکیان پرسیارێکم بۆ پێشهاتبوو، لە حافزم دەپرسی کە بەشکم بەو فاڵە وڵامم دەستکەوێ، هەرجارەی فاڵەکەم دەکردەوە وڵامێکی  زۆر رۆشن و دیارم دەست نەدەکەوت. بۆیە هەمیشە ئەو پرسیارەم لێ دەپرسییەوە. دەزانی ئاخرین جار وڵامەکەی چی بوو؟  ئەم بەیتە بوو:

بود کە یار نرنجد ز ما بە خلق کریم

کە از سؤال ملولیم و از جواب خجل

واتە: چەندە دەپرسی ماڵت نەشێوێ، بێزار بووم. شەرمەزارم و هیچ وڵامێکم پێ نییە!

بابەتەکە بەم غەزەلە شیرینەی سەعدی کۆتایی پێ دەهێنم. غەزەلێکی زۆر نایابە و من هەمیشە لە خەڵوەتی خۆم لەبەرخۆمەوە دەیڵێمەوە، هەڵبەت من هەمیشە ئەمە بەرامبەر پێغەمبەر دەخوێنمەوە. مرۆڤ دەتوانێ بۆ هەر کەس پێی خۆشبوو بیخوێنێتەوە، بەڵام لەروانگەی منەوە مرۆڤ دەتوانێ لەم رێگەیەوە لەگەل پێغەمبەر قسان بکات:

تو آن نه اي كه دل از صحبت تو برگيرند

و گر ملول شوي صاحبي دگر گيرند

و گر به خشم براني طريق رفتن نيست

كجا روند كه يار از تو خوبتر گيرند

به تيغ اگر بزني بي دريغ و برگردي

چو روي باز كني دوستي ز سر گيرند

هلاک نفس به نزديک طالبان مراد

اگر چه کار بزرگست مختصر گيرند

روا بود همه خوبان آفرينش را

که پیش صاحب ما دست بر کمر گیرند

قمر مقابله با روي او نیارد کرد

و گر کند همه کس عیب بر قمر گیرند

به چند سال نشاید گرفت ملکي را

که خسروان ملاحت به یک نظر گیرند

خدنگ غمزه خوبان خطا نمي افتد

اگر چه طایفه اي زهد را سپر گیرند

کم از مطالعه اي بوستان سلطان را

چو باغبان نگذارد کز او ثمر گیرند

وصال کعبه میسر نمي شود سعدي

مگر که راه بیابان پرخطر گیرند

واته تۆ یارێک نیت که دڵ له دانیشتن لەگەڵ تۆ هەست به بێزاری بکات. ئەگەر له دەستی ئەویندارانت دڵگیر و وەڕەز بیت، ئەوا روو دەکەنه یارێکی دیکه. هەروەها ئەگەر لێشیان زویر بی، چاره نییه، یاری له تۆ باشتر له کوێ پەیدا بکەن؟ رەوایه که هەموو ئەوانەی روخساریان جوانه، بێن و لەبەرامبەر مەعشوقی جوانڕوخساری ئێمه، چۆک دابدەن...

وسلام علیکم ورحمة الله